بەرهەمی ( 6 ) ی گروپی نما

# پەروەردەی ئیمانیی منداڵ

ئامادەکردنی :
سایە فارس






238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

📚 PDF کتێبی 📚 پەڕەی فەرمی
Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان
drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_






بەرهەمی گروپی نما... ژمارە (٦)

# پەروەردەی ئیمانی منداڵ

ئامادەکردنی : سا یە فارس

چاپی یەکەم

١٤٣٩ کۆچی ........... ٢٠١٧ زاینی

# ناسنامەی کتێب

※ ناوی کتێب: پەروەردەی ئیمانی منداڵ

※ ئامادەکردنی: سایە فارس

※ بەرهەمی گروپی نما ژمارە (٦)

※ نەخشاندنی بەرگ: بەهمەن عومەر

※ نەخشاندنی ناوەڕۆك: ناوەندی ڕێنوێن

※ نۆبەی چاپ: یەکەم

※ ساڵی چاپ: ١٤٣٨ ك - ٢٠١٧ زا

※ تیراژ: ٣٠٠٠ عدد

گروپی نما بۆ چاپکردنی کتێب و بەخشینی بەدیاری..

بەخشینێکی کەم، پاداشتێکی نەبڕاوە.

ئەم گروپە لە ئێستا لە تۆڕی کۆمەلایەتی فەیس بوك ٦٠ ئەندامی هەیە کە هەر ئەندامێك دەبێت چوارمانگ جارێك بڕی لانی کەم (٢٥٠٠٠)دینار بدات ئەگەرلە کوردستان بوو بۆ ئەو کەسانەی لەدەرەوی کوردستان دەبێت لانی کەم چوار مانگ جارێك بڕی (٥٠دۆلار ) بدات تا کۆبکرێتەوە کتێبی پێ چاپ بکرێت و بەدیاری ببەخشرێت، هەموو کەسێك دەتوانێت ئەو پاداشتە نەبڕاوە بەدەست بهێنێت، بەخشینێکی کەم پاداشتێکی نەبڕاوە.

نوینەرەکانمان لە (هەولێر، سلێمانی، هەڵەبجە، کۆیە، رانیە، قەلادزێ، کەلار، دەربەندیخان، هەندەران) هەیە.

هەرکەس حەزی کرد ئەم بەرهەمە چاپ بکاتەوە یان بەشداری بکات پەیوەندی بکات بەم ژمارانەوە

٠٧٥٠٣٢٤٠١٨٠ - ٠٧٧٠١٤٨٦٢٦٣

بەرهەمی حەوتەمی گروپ لە بەرواری ٢٠١٨/٤/١ پارەی بۆ کۆدەکریتەوە تکایە هەرکەس ویستی بەشدار بیت پەیوەندیمان پیوە بکات.

# پێشەکی

ئافرەتێك دەڵێت منداڵێکی پێنجساڵانم هەیە، لەگەڵ یەکێك لە منداڵی دراوسێکەمان هاورێ بوون، ڕۆژێك داوایان لێ کردم بچێتە ماڵیان و پێکەوە یاری بکەن، منیش پاش ئەوەی ڕەزامەندیم نواندو بۆ ئەوەی بێزاریان نەکات مەرجم بۆ داناو پێم گوت: ڕۆڵەکەم بەهێمنی و لەسەرخۆیی بێ ژاوە ژاو یاری بکەو داوای هیچ شتێکیان لێ مەکەو هیچ شتێکیش نەخۆیت، پاشان مۆڵەتم دا بڕوات و یاریان لەگەڵدا بکات.

ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی کە کوڕەکەم لە ماڵیان یاری کردبوو کاتی نان خواردن هاتبوو، ئەویش هەستا بوو تا بگەڕێتەوە ماڵەوە، داوایان لێ کردبوو کە بمێنێتەوەو نانیان لەگەڵ بخوات، ئەویش بە ڕێزەوە داوای لێ بوردنی لێ کردبوون و نەیخواردبوو، کاتێك زۆری لێ دەکەن دەڵێت: دایکم پێی وتووم لە ماڵی کەس هیچ شتێ نەخۆم، ئەوانیش پێیان وتبوو خۆ دایکت ئاگادار نیەو ناتبینێت، لە وەڵامدا وتبووی ڕاستە دایکم نامبینێت، بەڵام خوای گەورە دەمبینێت!

بۆ ڕۆژی دواتر دراوسێکەمان بە پێکەنینەوە باسەکەی بۆ گێڕامەوەو زۆر دڵخۆش بوو بەوەی منداڵەکەی هاوڕێیەکی بە ڕەوشتی لەو شێوەیەی هەیە.

بەڵێ منداڵ وەك خاکێکی بە پیت وایە ئەگەر تۆوێکی پاكو بێ خەوشی تێدا بچێنرێت، ڕوەکێکی باشو بە بەرهەم دەڕوێت، بەڵام ئەگەر ئەو خاکە پشت گوێ خراو تۆوەکەی بێ کەڵك بوو، ئەوا ئەو بەرهەمەی دروست ئەبێت پڕ دەبێت لە دڕكو داڵو گیای زیان بەخش.

دایکانو باوکانی بەڕێز: پەروەردەی منداڵ گەورەترین بەرپرسیارێتیە لەسەر شانی هەموو لایەك بێ جیاوازی، دڵنیا بن پەروەردەی دروست منداڵی باش بەرهەم دێنێت، هەر هەنگاوێك کە منداڵەکەت دەیبڕێت لەسەر ئەو ئامۆژگاریو هەڵویستانەی کە ئێوە فێرتان کردووە، دەبێتە مایەی خێرو بەرەکەت بۆ دونیاو دوا ڕۆژتان.

سایە فارس

## پێش کەشـــــــە ...

❁ بە هەموو دایك و باوکێك کە نیازی پەروەردەیەکی دروستی منداڵەکەیان هەیە.

❁ بە هەموو ئەندامانی بەڕێزی **گروپی نما** .



## پەروەردەی ئیمانی بۆ؟

مەبەست لە پەروەردەی ئیمانی پەیوەستکردن‌و ناساندنی منداڵە لەسەرەتاکانی تەمەنییەوە بە بنچینەکانی باوەڕ بەخوداو هەموو بوارەکانی تری پەیوەندیدارو فێرکردن‌و تێگەیاندنی بنەما شەرعیەکان لە بیروباوەڕ (عەقیدە)و پەروەردە ڕەوشتییەکان کە کۆمەڵە بنەمایەکی ڕەوشتی‌و ڕەفتارو هەڵس‌و کەوت‌و ویژدانیە کە پێویستە بەگوێی منداڵدا بدرێت‌و بە کردەوەش لە دەورو بەریەوە بیبینێت بۆ ئەوەی بە دەستیان بهێنێت‌و لەو تەمەنە کەمەوە لەسەریان ڕابێت، لەبەر ئەوە پێویستە باوان یان پەروەرشکار منداڵ ڕابهێنن‌و پەروەردەی بکەن لەسەرەتای پێگەیشتن‌و تێگەیشتنی لە بنەما شەرعی‌و پەروەردەییەکان هەتا پەیوەندییەکی پتەوو دانەبڕاو لە نێوان منداڵ‌و ئیسلام لە ڕووی بیروباوەڕو پەرستشەکان‌و مامەڵەکردن.

پێگەیاندنی منداڵ لە سەرەتاوە لە سەر بنچینەکان کارێکی زۆر گرنگە، چونکە منداڵ بە سروشت‌و فیترەیەکی

پاکەوە لە دایك دەبێت، لەو ژینگەیەی تێیدا هاتووەتە دونیاوە خۆی دەبینێتەوەو چی لەو ژینگەیەدا چێنرابێت لەسەر ئەو بنەمایە بەرهەمەکە دروێنە دەکرێت، پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت دەفەرموێت: (مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ)، بخاری ڕیوایەتی کردووە.

واتە هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتێکی پاك دێتە دونیاوە، دایك و باوکی دەیکەنە یەهودی یان مەسیحی وە یان مەجوسی)، بۆیە باوان لێپرسراوێتییەکی گەورەیان لەسەر شانە لە چۆنێتی پێگەیاندنی منداڵ دا.

باوەڕهێنان بە خودای مەزن (جل جلالە) لە گرنگترین بنەماکانە وا لە منداڵ دەکات کاتێك گەورە بوو بە بەرپرسیارێتیەکان هەڵسێت، وە سیفەتی جوان و خێری تێدا ڕەنگ دەداتەوە، خۆشەویستی و تەقواو ترسان لەخوای گەورە بنچینەی پەروەردەی منداڵە، باش وایە باوان ڕێگە نەدەن هیچ هەلێکیان لە دەست بچێت لە گەیاندنی ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی جێگر بوونی ئیمان لە دڵی منداڵدا.

## پەروەردەی ڕەوشت:

ناکرێت ڕەوشت لە دین جیابکرێتەوە، بۆ ئەوەی باوان پەروەردەیەکی جوان و دروست بکەن پێویستە خۆیان خاوەنی ڕەوشتێکی جوان بن و هێمنی و لەسەرخۆ بن و دوور بن لەهەر سیفەتێکی ناپەسەندوو نادروست کە وای لێ بکات مەبەستەکەی گومانی تێدا بێت و پەیامەکەی نەگات کە پەروەردەیە!

ئەو مندالەی لەسەر باوەڕبەخوداو خۆشەویستی خوداو پشت بەستن پێی لە داواکردنی پێداویستییەکانی و ملکەچ بوون پێ بگات ئەوا لە گەورەبووندا پابەند دەبێت بە هەموو کردەوەیەکی باش و کاری خێر، وە لە هەموو کارێکی خراپ و گوناه دوور دەکەوێتەوە.

## ئەمێ کردنی منداڵ:

ئێمەی باوان و پەروەرشکاران بەر پرسیارێتییەکی هەرە گەورەمان لەسەر شانە لە پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر خێرو چاکەو بنەما ڕەوشتیە جوانەکانی ڕاستگۆیی و پاراستنی ئەمانەت و بەخشین و ڕێزگرتنی گەورەکان و خۆشەویستی کەسانی ترو پاراوکردنی زمانیان بە وتەی جوان و ڕێگە نەدان لە بەکارهێنانی هەروشەیەکی نەشیاوو بێزراو، هەروەها ڕاهێنانیان لەسەر جێبەجێ کردنی هەستە مرۆڤایەتییەکانی وەك بەسۆزی و میهرەبانی و چاکە کردن لەگەڵ هەژاران و بێ نەوایان وە هەر ئاکارێك کە پەیوەندی بە ڕەوشتە جوانەکانەوە هەیە.

گومانی تێدا نییە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی سەرورەرمان درودی خوای لێبێت و ژیاننامەی پێغەبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی گەنجینەیەکی پڕگەوهەری ئامۆژگاری و ڕێنیشاندەر، ئەگەر پابەند بین پێیانەوە ئەوا نەوەیەکی بەهێزو بە ڕەوشت و بە توانا بەرهەم دەهێنین، باشترین و سەرکەوتووترین ڕێگە بۆ تێگەیاندنی منداڵ لە بنەما

ڕەوشـتی و ئیمانیـەکان لـەو تەمەنـە بچـووکەدا گفتووگـۆو گێڕانـەوەی چـیرۆك لـە مێشـکیدا جێگـر دەبێـت کـە دەیانبیسـتێت، وە تێبـینی کردنـی ڕەفتـاری گـەورەکان کـە دەبنـە پێشـەنگ بـۆی، چـونکە منـداڵ لاسـایی ڕەفتـاری گەورەکان دەکاتەوە، بینین زیـاتر کاریگـەری دەبێت وەك لـە بیسـتن، بـۆ نموونـە کاتێـك دایـك یـان بـاوك هەمیشـە بـە منداڵەکانیان دەڵێن ڕاستگۆ بن و لـە درۆ دوور بکەونـەوە، لـە هـەمان کاتـدا دەبینێـت لـە خۆیانـدا جـێ بـەجێی ناکـەن بـۆ نموونە: لە دەرگا دەدرێت یان تەلەفۆن دەکرێت بە منداڵەکە دەڵێن تۆ وەڵام بدەرەوە ئەگەر فلانـە کـەس بـوو بڵـێ دایکـم یان بـاوکم لـە ماڵـەوە نییـە، یـان بـەڵێنێك بـە منـداڵ دەدەن بەرامبـەر کردنـی کارێـك کـە پێیـان سپاردووە، پـاش ئـەوەی فەرمانەکـەی جێبـەجێ کـردووە بەڵێنەکـەیان نەبردووەتـە سـەر، ئـەو کاتـە دەبنـە پێشـەنگێکی خـراپ کـە هۆکـارە بـۆ دروسـت بـوونی نەوەیـەکی نادروسـت، لەبەرئـەوە پێویسـتە باوان هەمیشە ڕاستگۆیانە لەگـەڵ منداڵەکـەیان بـدوێن و بـۆ ئارامکردنەوەو ژیرکردنـەوەیان لـە گریـان پـەنا نەبەنـە بـەر درۆکـردن و پـەیمان پێـدانیان بـە ناڕاسـتی، بـۆ ئـەوەی

نەوەكانیان لەسەر درۆكردن ڕاندەهێنن بۆ ئەوەی خۆیان بیانەوێت، بە داخەوە هەندێك باوان بۆ پەروەردەكردنی منداڵەكانیان ئەو ڕێگەیە بەكاردەهێنن.

بە دڵنیاییەوە ڕەوشتی جوان بەندە لەسەر باوەڕ بە خوای گەورەو ئیسلامیش زۆر جەخت لەسەر ڕەوشتی جوان دەكاتەوە لە هەموو حاڵەتەكاندا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩ ﴾ الاعراف.

واتە: كاری ئاسان لەخەڵكی داوا بكەو چاوپۆشی لە هەڵەو كەموكوڕیەكانیان بكەو، فەرمان بدە بە چاكەو كردەوەیەك كە پەسەندی شەرعە، ڕووش وەرگێڕەو پشت بكە لە نەفام و تێ نەگەیشتوان.

وە لە سورەتی فصلت لە ئایەتی ٣٤- ٣٥ دەفەرمویێت:

﴿ وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ٣٤ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ٣٥ ﴾

واتە: بێگومان چاكە و خراپە وەك یەك نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بەجوانترین و چاكترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادروستی بكە، ئەو كاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی كە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی و ساردیەك هەیە، دەبێتە دۆستێكی دڵسۆز و گیانی بەگیانی.

جا كەسیش ناتوانێت بەو ڕەفتارە هەستێت جگە لەوانەی كە ئارامیان گرتووە، هەروەها كەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وا بنوێنێت جگە لە كەسێك نەبێت كە خاوەنی بەهرەیەكی گەورە بێت.

هەروەها لە سورەتی ال عمران ئایەتی ١٣٤ دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ ﴾

واتە: ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ڕق و كینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خەڵكی خۆش دەبن و لێبووردەن، خوای میهرەبانیش چاكەكارو چاكەخوازانی خۆش دەوێت.

پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێت: ( أَثْقَلَ مَا يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُسْنُ الْخُلُقِ ) یان ( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق ).

توێژینەوەکان سەلماندوویانە لە باشترینی هۆکارەکان بۆ ڕاست کردنەوەو جێگربوونی ڕەفتارو ڕەوشتی منداڵ برتییە لە پەروەردەیەك کە لەسەر بیروباوەڕی دینی بنیات بنرێت، سەلەفی صالح نەوەکانیان هەر لەسەرەتای تەمەنیانەوە لەسەر بەرنامەی پەروەردەی ئیسلامی پێگەیاندووەو ئامۆژگاری دایکان و باوکانیشیان کردووە کە هەمان ڕێچکە بگرنە بەر، لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی درووست بوونی نەوەیەك کە ڕووداوی گرنگ بخولقێنن و ڕەفتارو کرداری جوان سیمایان بێت و هەوڵ بۆ کارە چاك و جوانەکان بدەن.

ئەمەش ئەو ڕێگەیەیە کە پێویستە باوان بۆ داهاتووی منداڵەکانیان بیگرنە بەر، چونکە ئاراستەکردنی نەوەکان بەبەرنامەیەکی دروست پارمەتی منداڵ دەدات لە پێکهێنانی بنەماکانی ژیانی چ بۆ دونیای چ بۆ قیامەتی، کاتێك

منداڵێك تێ دەگات كە تەنها ژیان بۆ دونیا نیەو دینی خوای گەورە بە درووستیو دوور لەهەر شێواویو ئەو ناڕاستیانەی تێكەڵ بە دین كراوە، بە دڵنیایی نەوەیەكی تەندروستو سوود بەخش بۆ خودی خۆیو كۆمەڵگەكەی پێك دێت، ئەویش بەچەند خاڵێك ئاماژەی پێ دەكەین:

یەكەم: وتەیەك هەیە دەڵێت بیست ساڵ پێش لەدایك بوونی، منداڵەكەت پەروەردە بكە، مەبەست لەم وتەیە ئەوەیە لاوەكانمان كاتێك هاوسەرگیری دەكەن ئافرەتێكی باش و بە دین یان پیاوێكی باشو بەدین بكاتە هاوسەری خۆی بۆ ئەوەی یارمەتی دەر بێت لە دروست بوونی نەوەیەكی پەروەردە درووست.

دووەم: دەتوانیت پێش دروست بوونی منداڵ هەنگاوەكانی پێكهێنانی نەوەیەكی باش بنێیت، بۆ نموونە: كاتێك هاوسەرەكان كۆبوونەوە، پێویستە پێش ئەوە دوعا یان زیكری پێش سەرجێی كردن بخوێنن كە ئەمەیە:

( "بِسْمِ اللَّهِ ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ ، وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا" ) واته: بەناوی خودا ئەم کارە پیرۆزە ئەنجام دەدەم، خودایە شەیتانمان لێ دوور بخەرەوە، هەروەها شەیتان دوور بخەرەوە لەوەی کە پێمان دەبەخشیت لە منداڵ، چونکە پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت: ئەو منداڵەی دروست دەبێت لە شەیتان پارێزراو دەبێت.

سێیەم. کاتێك منداڵ لە دایك بوو و هاتە دوونیاوە و چەند ساڵێکی سەرەتای تەمەنی بڕی و بە باشی تێ دەگەیشت هەوڵ بدە هەمیشە ناوی خودای گەورە بە باشی لەلایدا ببرێت، بەتایبەتی لە کاتی هەڵویستە دڵخۆشکەرەکان و خۆش ویستراوەکان، هەرگیز باسی ئەو سزایانە نەکات لەلای منداڵ کە ببێتەهۆی ترسان و ڕق لێبوونەوەی منداڵ بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە توڕەو دڵتەنگە، یان کاتێك هەڵەیەك دەکات، بۆ نموونە: منداڵ کارێکی نادروست یان درۆیەك دەکات، پێی مەڵێن خودا کوێرت دەکات یان دەتخاتە ناو ئاگر ..... هتد، چونکە

هـەموو ئـەم جـۆرە هەڕەشـانە منـداڵ لـە خـودا دوور دەخاتەوەو هیچ خۆشەویستی بۆ خـودا نابێت چونکە ئەو هەمیشە لـە کـاتی سزاو هەڕەشـە لێکردن نـاوی دەبیستێت، ئەمەش هەڵەیەکی زۆرو ستەمێکی گەورەیە لە منداڵەکانیان دەکەن، بۆ دوورکەوتنەوە لـەم هەڵویستە پێویستە هەمیشە بـاس لـە جوانیـەکانی بکرێـتو ئـەو هەسـتەش لای منـداڵ بخولقێنێـت کـە خـالقێکی هەیـەو هـەموو دەمـێ چـاودێری دەکاتو ئەوی خۆش دەوێتو یارمەتی دەدات، بیرخستنەوەی ئـەو بەخششـانەی بیربخرێتـەوە کـە خـودای گـەورە پێـی بەخشیوە.

چـوارەم: ئاراسـتە کردنـی منـداڵو ئاشـنا کردنـی بـە جوانییەکانی سروشت کە لەلایەن خودای گـەورەوە فەراهـەم هێنـراوە، بـۆ ئـەوەی هەسـت بـە گـەورەیی‌و دەسـەڵاتی خـودا بکەن.

پێنجەم: خۆشەویستی دەوروبەر لەناخی منداڵ بچێنرێت ئـەویش بـە بەخشـینی خۆشەیسـتی‌و دەربـڕینی بـۆی، وە

خۆشەویستی خودای گەورە، لەبەر ئەوی خودا ئەوی خۆش دەوێت هەموو دوونیای خستووەتە ژێر ڕکێفییەوە.

شەشەم: فێرکردنی شێوازی گفتووگۆو گوێگرتن لە بەرامبەرو ڕاهێنانی لەسەر بەزەیی پێداهاتنەوەو میهرەبانیو هاوکاری کردنی کەسانی تر، چاندنی بەها جوانەکانی ئیسلام لەناو دڵیدا لە ڕێی پێشەنگی باشەوە، چونکە منداڵ هەموو ئاکاری بەخێوکەرو پەروەرشکارەکەی وەردەگرێت، کاتێك ئەو شتانە بەکردار دەبینێت ئەویش بەهەمان شێوە دووبارەی دەکاتەوەو تێیدا دەبێتە خوو، وە کاتێك تێگەیشت لەبەرامبەر هەر کارێکی باشدا پاداشتی لای خوای گەورە هەیە، ئەو کات هەرکارێك پێی هەڵسا پەیوەستی دەکات بە خوای گەورەوە ئەمەش دەبێتە مایەی ئاسوودەیی ڕۆحو دەروونی.

حەوتەم: بەهەل زانینی ئەو کاتانەی کە منداڵ تووشی کێشەو ڕووداوی نەخوازراو لەگەڵ دەوروبەر یان هاوڕێکانی دەبێت، بۆ گەیاندنی مەبەستە پەروەردەییەکە ئەویش بە

ئاڕاستەکردنێکی ژیرانە کە چاکەی خۆش بوێت‌و لە خراپە دوور بکەوێتــەوە، وە دوورکەوتنــەوە لــە ســەرکۆنە کردنــی منــداڵ، تەنانــەت ئەگــەر کــارێکی زۆر هەڵەشــی کردبێــت، پێویســتە بــە شــێوازی هێمنانــە پرســیاری لــێ بکرێــت‌و بــە دڵێکی فراوانەوە وەڵامەکەی وەربگرێت دوور لە هەر توندو تیژییــەك‌و بــە شــێوازێك گفتووگــۆی لەگــەڵ بکرێــت لەگــەڵ تەمــەنی تێگەیشــتنی ئــەودا بگونجێــت، ئەمــە کاریگەرییــەکی گەورەی هەیــە لــە بەدەســت هێنــانی دڵــی منداڵدا لــە هــەمان کاتیشدا ئەو هەڵویستانە دەبنە هۆی چاندنی بەهاو ڕەوشتی جوان لای منداڵ‌و گۆڕینی ڕەفتارەکانی بەرەو باشتر.

هەشتەم: پێویستە منداڵ بەکردار ڕابهێنرێت لــە ڕەوشــتە ئیسلامییەکان کــە زۆر گرنگــە بــاوان پابەنــد بێــت پێیانــەوە وەك وتنی ئەو زیکرانەی لە کاتی نان خــواردن‌و ســەرکەوتنە ناو ئۆتۆمبیل ئادابەکانیان ...... هتد)، بەو جۆرە وێنەیــەکی جوان دەکێشێت بە هەڵس‌و کەوتەکانی‌و نموونەیەکی جوانی ئیسلام وێنــا دەکــات کــە شــایانی چــاو لێکــەری بێــت‌و هــانی

منداڵ بداتن کە پابەند بێت بە یاساو ڕەوشتە ئیسلامیەکانەوەو بنەماکانی کە هۆکاری باشی کۆمەڵگایە، دڵخۆش دەبێت بە بەرهەمی ڕەفتارەکانی کەمایەی پێشکەوتن و شارستانیەتە، بەوەش خۆشەویستی و پاك و خاوێنی و پاراستنی ئەمانەت ڕاستگۆیی و خۆشویستنی هەر فەرمانێك کە لە ئیسلامەوە کرابێت لەلای گەشە دەسەنێت، ئیتر ئەمەش وا لە منداڵ دەکات بیر لە هیچ شتێك نەکاتەوە هەتا نەزانێت سوودی هەیە بۆ خۆی و کۆمەڵگەکەشی، بەوەش خێر دەبێتە تۆوێکی چەکەرە کردوو لە ناخ و دەروونیدا.

نۆیەم: پەروەرشیار دەتوانێت سوود لە چیرۆکی ئامانجدار وەربگرێت، چیرۆکی ئاینی بێت یان واقعی وە یان خەیاڵی بە جۆرێك ببێتە پێ خۆرێك لە ڕەفتاری منداڵدا، وە هانی دەدات پێوەی پابەند بێت، باش وایە گێڕانەوەکە بەشێوەی نواندن یان بینراو بێت و ئامانجی دیاری بکات نەك تەنها بۆ خۆشی و کات بەسەربردن.

دەیەم: پێویستە ئاڕاستەکان بۆ منداڵ لە قورئان و سونەتی پێغەمبەری ئازیزەوە هەڵقولا بێت، وە منداڵیش هەستی پێ بکات، بۆ ئەوەی لەسەر خودا پەرستی ڕا بێت و پێغەمبەریش دروودی خودای لەسەر بێت بکاتە سەر مەشق و پێشەنگی خۆی و لەسەر ڕێبازی ئەو گەشە بکات، ئاڕاستەوخۆ باوک کاتێک زانی هەموو منداڵەکانی کۆ بوونەتەوە، دەتوانێ بەتایبەتی ڕۆژانی هەینی بۆ گەیاندنی ئەو پەیامەی کە خۆی مەبەستییەتی بە منداڵەکانی بگەیەنێت بۆ نموونە ڕوو بکاتە دایکیان و بڵێ ئەمڕۆ لە وتاری ڕۆژی هەینی دا مامۆستای وتاربێژ باسی بابەتێکی کرد، دەتوانێ خۆی ئەوەی مەبەستیەتی باسی بکات و چیرۆک و سەرگوزشتەی بۆ زیاد بکات، ئەو کات منداڵەکان هەموو گوێی لێ دەگرن و سوودی لێ دەبینن.

یازدەیەم: میانڕەو بوون لە پەروەردەی ئیمانی بۆ منداڵ واتە کارێکی پێ نەسپێردرێت کە لە توانای ئەودا نییە، یان بەرپرسیارێتی گران نەخرێتە ئەستۆی هەتا دوور نەکەوێتەوە لەو ئەرکەی پێی سپێردراوە، پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر بێت ئاماژە بەهەڵبژاردنی ئاسانی کارێک

دەکات کە لە نێوان دوو کاردایە، بەمەرجێك لە سنووری شەرعدا بێت، بیرتان نەچێت یاریو گەمەکردن جیهانی تایبەتی منداڵن بۆ ئەوەی ماندوو نەکرێن بە شتێك ڕێ لە گەشەی سروشتیو لاشەییان بگرێت، واتە کارێك نەکرێت قۆناغی منداڵیان لێ بسەنرێتەوە، بەڵکو پێویستە ڕێگە بدرێت منداڵی خۆی ببینێتو لەهەمان کاتیشدا خۆی بتوانێت بە هەندێ کار هەڵسێتو تواناکانی خۆی دەربخاتو متمانەی بە خۆی لا دروست ببێت، بۆ ئەوەی تەنها پشت بە دەوروبەری نەبەستێت.

دوازدەیەم: هاندانی منداڵ کاریگەری باش لەسەر منداڵ دروست دەکاتو هەوڵ دەدات خۆی بە دواداچوون بکات بۆ ئەو شتەی لای بووەتە پرسیار، هەر ئەمەش خۆشەویستی بۆ ئەو کارەی پێی هەڵدەسێت دروست دەکات، لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە هەرکاتێك پەروەردەو باشکردنی ڕەفتاری منداڵ لەسەر بنەمای ڕێزو خۆشەویستی بێت، ئەوا دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی ڕەفتاری ڕێكو دروست، وە پێویستە یارمەتی منداڵ بدرێت لە بە دەست هێنانی مافەکانی خۆیو

دیاری کردنی راستیو ناڕاستیەکان، بەڵام بە شێوازێکی جوانو نەرمو نیانی، بۆ ئەوەی منداڵ هەست بە کەرامەتو مەکانەتی خۆی بکات لەناو خێزانو کۆمەڵگەکەیدا، ئەمەش بە ڕێکخستنێکی جوانو دوور لە ناز پێدانی زیاد لە پێویست.

سیازدەیەم: چاندنی ڕێزو خۆشەویستنی قورئانی پیرۆزو بەرز ڕاگرتنی لە دڵی منداڵدا، ئەوەش وا دەکات هەست بە پیرۆزیو پابەندبوون بە فەرمانەکانی بکات، بە شێوازێکی سەرنج ڕاکێشو ئاسان، تێگەیاندنی منداڵ بەوەی هەوڵدان بۆ فێربوونو خوێندنی قورئان پلەی لە فریشتەکان نزیک دەکاتەوە، ئەمەش وا لە منداڵ دەکات لە کەشێکی ئیمانیو بنەماو زانیارییەکانی ئیسلام وەربگرێت.

پەروەرشیار پێویستە بە هیمەتو هۆشیارییەوە هەنگاوی جێگیر ببڕێت بۆ بنیاتنانی موسڵمانێکی هۆشیار.

## چۆن خۆشەویستی خودا لە دڵی منداڵەکەم بچێنم؟

بۆ ئەوەی خوای گەورە بە نەوەکانمان بناسێنن و خۆشیان بوێت پێویستە بە چەند قۆناغێکدا بڕۆین ئەوانیش:

**قۆناغی یەکەم: قۆناغی پێش هاوسەرگیری.**

ئەگەر تۆوێکی باش بخرێتە ناو خاکێکی بێ کەڵك و بێ پیتەوە ئەوا دەمرێت و هیچ بەرهەمێك نادات بەدەستەوە، لەبەر ئەوە ئیسلام هەڵبژاردنی هاوسەر بۆ کوڕو کچەکانمان بەیەکێك لە مافەکانی منداڵ دادەنێت لەسەر دایك و باوك، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾ ﴾. النور

واتە: (ژنانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك و پیاوانی ناپوخت بۆ ژنانی ناپوخت، ئافرەتانی پاکیش بۆ پیاوانی پاك، پیاوانی پاکیش بۆ ئافرەتانی پاك، ئەو پاکانە بەرین لەو تۆمەتانەی کە ناپاکان هەڵی دەبەستن (چونکە محمدی پاك

هاوسەری عائیشەی پاکە صلی الله علیه وسلم)، بۆ ئەو چاکانە لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی بەنرخ ئامادەیە).

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (تنكح المرأة لأربع: لمالها ولجمالها ولحسبها ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك).

مەبەستی ئەم فەرموودە پیرۆزە ئەوەیە کە ئافرەت لەبەر چوار هۆکار مارە دەکرێت: ماڵو سامانی، جوانییەکەی، بنەماڵەکەی، وە دینەکەی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: ئافرەتی دیندار بخوازرێت.

کەواتە قۆناغی یەکەم هەڵبژاردنی هاوسەری بە دینو باشە بۆ نەوەکان.

**قۆناغی دووەم: قۆناغی دوای هاوسەرگیری.**

دوای ئەوەی هاوسەرگیری کراو ئافرەتەکە لەو ساتەی زانی دووگیان بووە، پێویستە زۆر لە خوای گەورە نزیك ببێتەوەو سوپاس گوزار بێت بەو بەخششەی پێی بەخشیوە، بۆ ئەوەی هەست بە ئارامی دڵو دەروونی بکات، چونکە لە لێکۆڵینەوەیکدا دەڵێت: ئاسوودەیی دایك بۆ تەندرووستی

کۆرپەکەش بەسوودە، باش وایە دایك زۆر گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرێت، بە دڵنیاییەوە بە منداڵەکەش دەگات، دوای لە دایك بوونیشی لە ژیانی داهاتوویدا پەیوەست دەبێت پێوەی، هەر لەو لێکۆڵینەوەیەدا دەرکەوتووە لە کاتی دووگیانیدا دایك ئارەزووی چ خواردنێك بکات ئەوا ئەو منداڵەی لە داهاتوودا ئارەزووی هەمان خواردن دەکات، کەواتە کاتی دووگیانی سەرەتاییەکە بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکە.

**قۆناغی سێیەم: سەرەتای لە دایك بوون _تەمەنی دوو ساڵی.**

کاتێك منداڵ لە دایك دەبێت تا دوو ساڵو قۆناغی شیرخواردن گەشەی خێراتر دەبێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژیان بەراورد بە گەنجێکی پێگەیشتوو، لەبەرئەوەی منداڵەکە وەك پەڕەیەکی سپی وایە ئەوەی بتەوێ لەسەری دەنووسیت، بەڵام گەنجەکە زۆرگرانە قەناعەت پێکردنی، بۆیە ئەو کاتانەی کە لە ئامێزی دایکەکەدایە باش وایە تەسبیحاتو روقیەی شەرعی بەسەردا بخووێنێت، یان بە

دەنگ بۆی لێ بدرێت و گوێی لێ بگرێت، لەگەڵ گەشەی منداڵەکەو سەرەتای فێربوونی قسەکردندا لە باتی وتنی هەندێ ووشەی بێ سوود بەرامبەر منداڵەکە وشەی (الله) بدرێ بە گوێی منداڵەکەدا، یان هەوڵ بدرێت زۆرترین وشە گوێی لێ دەبێت وشەی (الله) بێت، وە کاتێك پێ دەگرێت و هەوڵی ڕۆشتنی دا دەستی بگیرێت و پێی بووترێت یا الله وەك یارمەتییەك بۆی، دایکی ژیرو هۆشیار هەمیشە لە ساتە خۆشەکاندا ناوی خوای گەورە بیری نەوەکەی دەخاتەوەو وای لێ دەکات دڵی پەیوەست بکات بە خوای گەورەوە نەك بە ترساندن و دوور خستنەوەو ڕق خستنە ناو دڵی بەرامبەر پەروەردگار.

**قۆناغی چوارەم: قۆناغی دوو ساڵ _ سێ ساڵ.**

لەم تەمەنەدا منداڵ مێشکی کراوەیە، لەم کاتەدا دەتوانرێت سوورەتە کورتەکانی وەك سورەتی ( فاتحەو قل هو الله احد و العصرو الکوثر و المعوذتین ....) پێ لەبەر بکرێت ئەوەش بە پێی توانای بۆ لەبەرکردنی، هەروەها

فێرکردنی (الله خوامانه، محمد پێغەمبەرمانە، ئیسلام دینمانە، کەعبە قیبلەمانە، قورئانی پیرۆز کتێبمانە).

**قۆناغی پێنجەم: لە سێ ساڵی _حەوت ساڵی.**

قۆناغی وەرگرتنی زانیارییە لەلایەن منداڵەوە، چاولێکەری ڕەفتارو هەڵس و کەوتی خێزان و دەوروبەرەکەیەتی، لەم تەمەندا زۆر ئارەزووی گوێ گرتن لە چیرۆك دەکەن، بۆیە پێویستە سوود لەم هەلە وەربگیرێت بۆ گێڕانەوەی چیرۆکی بەسوود و ئامانج دار بەو ئاکارو ڕەوشتانەی کە ئارەزووی دەکەیت، باش وایە هەموو ئەو چیرۆکانە تایبەت بێت بە بە کەسێك و هەموو کات هەمان ناو بۆ کەسایەتی چیرۆکەکە دابنێیت، ( ئەگەر منداڵەکەت کوڕ بوو کارەکتەری چیرۆکەکە کوڕ بێت وە ئەگەر کچ بوو کارەکتەرەکە کچ بێت)،، دایك یان باوك دەتوانێت لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکاندا سیفەتەکانی خوای گەورەی تێدا ئاماژە پێ بکات، وەك بەسۆزی و میهرەبانی و بەزەیی و بەخشندەو لێخۆش بوو ........ هتد). هەروەها پێویستە

بزانرێت منداڵ چ جۆرە ئاژەڵێکی خۆش دەوێت چیرۆکی لەسەر بڵێت ، ئەگەر هاتو دایك توانای دانانی چیرۆکی نەبوو دەتوانێت سوود لە چیرۆکی منداڵانەی ئامادەکراو ببینێت، چەندین چیرۆکی پەروەردەیی هەیە کە باس لە پەروەردەی منداڵان دەکات بە چیرۆك یان چیرۆکی پێغەمبەران، کە وێنەدارەو ڕەنگاو ڕەنگەو سەرنجی منداڵەکە ڕادەکێشێت، باش وایە ئەو کتێبانەی چیرۆکی تێدایە ڕەنگاو ڕەنگو وێنەدار بن، واتە نوسینی کەمو وێنەی گەورەی تێدا بێت.

**قۆناغی شەشەم: نێوان حەوت ساڵ _ دە ساڵ.**

قۆناغێکی زۆر گرنگە لە ژیانی منداڵدا، بۆیە نابێت بە هیچ شێوەیەك کەمتەرخەمی تێدا بکرێت لەم قۆناغەدا بە شێوەیەکی باش عەقڵو بیری دەکرێتەوە، پێویستە لەم قۆناغەدا هاوڕێیەتی بکرێتو مامەڵەی وەك هاوڕێیی لەگەڵ بکرێت، هەر لەم قۆناغەدا دەتوانرێ بیرۆکەی بەندایەتی بۆ خوای گەورە لە دڵو دەروونیدا بچەسپێنرێت،

بۆ نموونه دیارییەکی پێش کەش دەکەیت ئەویش لەبەرامبەردا سوپاست دەکات، تۆش ئەوە بە هەل بزانەو پێی بڵێ بەخشەری یەکەم خوای گەورەیە کە شایانی سوپاس و ستایشە، یان پێی بڵێی ڕات چییە لەسەر چاوەکانت؟ ئایا بەلاتەوە بەنرخن؟ ئەگەر کەسێک پێت بڵێت گەوهەری دونیات پێت دەبەخشم بەرامبەر بەخشینی چاوەکانت، ئامادەی بیانبەخشیت؟ هەروەها گوێ و زمان و ئەندامەکانی تر؟ بێ گومان وەڵامی نەخێر دەبێت، ئەو کات لە ناخی دا گرنگی ئەندامەکانی هەست پێ دەکات و بەهایان دەزانێت و پاشان گەورەیی و مەزنی بەخشەرەکەی کە خوای گەورەیە بۆ دەردەکەوێت و خۆشەویستی بۆ دروست دەبێت بەرامبەری و هەرکاتێک بیری لە هەر یەکێک لەم نیعمەتانە کردەوە، بە تایبەتی ئەگەر پێی بوترێ بیهێنە پێش چاوی خۆت ئەگەر یەکێک لەم بەخششانە لە تۆیا کێشەی هەبووایە، بۆ نموونە کەڕ یان نابینا بویتایە چ هەستێکت دەبوو، یان ژیانت بە چ جۆرێک دەبوو؟ ئەو کات بە

تامەزرۆییەوە سوپاسی خوای گەورە دەکاتو یادی دەکاتـەوە بـە جـوانترین شێوە کـە لـەو نیعمەتـە جوانانـە بێ بەشی نـەکردووە، کەواتـە ئـەو ئەندامانـە زۆر زۆر گـرنگترن لـەو دیارییانەی کە دایكو باوكت پێی دەبەخشێت بۆیە پێویستە هەمیشە سوپاسگوزار بێتو خۆشەویستی خوا لە دڵیدا گەشە بکات.

**قۆناغی حەوتەم: قۆناغی ١٠ساڵی بۆ سەرەوە.**

لـەم قۆناغـەدا بـەڕوونی دیمەنـەکانی سـەربەخۆ بـوونی منـداڵو متمانـــە بـــە خۆبـــوونو ســـەلماندنی ڕای خـــۆیو هەڵگەڕانـــەوە لـــە ئامۆژگارییـــەکانی دایـــكو بـــاوكو زانیاریـەکانیان دەردەکـەوێت، لەبەرئـەوەی هەسـت دەکـات دایـكو بـاوکی ڕۆڵـی سـەرکردەیەکی دیکتـاتۆر دەبیـنن، لـەم تەمەنەدا ئارەزووی دەرباز بوون لەو کۆتو بەندە دەکات کـە گومـانی لـێ هەیـە، زیـاتر مـەیل بـۆ لای هاوڕێکـانی دەکـاتو ناخی خۆی بۆیان دەکاتـەوەو ئـەوەی لـەوانی وەردەگرێت لـە دایـكو بـاوکی ڕەتـی دەکاتـەوە، بۆیـە پێویسـتە زۆر بـە

هۆشیارانە ڕەفتار بکرێت لەگەڵیان، بە چیرۆکی خۆتان یان ئەو بەسەرهاتانەی بەسەر هاوڕێو کەسانی تردا هاتووە مەبەستەکەتان ڕوون بکەنەوەو تێی بگەبنن باشترین هاوڕێ خوای گەورەیەو باشترین ئەمانەت پارێزو باشترین پشتو پەنایە، هاوڕێ یەتی کردنی هەرگیز دژایەتی نیە لەگەڵ هاوڕێیەتی کردنی هاوڕێکانیو دەتوانێت کاتێکی خۆشیان لەگەڵ بباتە سەر بەمەرجێك ئەو هاوڕێیەتیە دووربێت لەهەموو ڕەفتارێکی ناپەسەند کە هەموو کەسێك ڕەتی بکاتەوەو بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ دینو کەلتوری کۆمەلگاکەی دا دژیەك بوون.

خۆشویستنی خودا بەچەند دیرێك نوسین ناتوانرێت دەربرێت، بەلآم ئەم هەنگاوانەی باسکران پشتیوان بەخوای گەورە ڕێگەیەك بۆ بەدەست هێنانی خۆش ویستنی خودای پەروەردگار ڕوونو ئاسان دەکات، بەو هیوایەی سوودی هەبێت بۆ هەموو باوانو پەروەشیاران.

## چۆن خۆشەویستی پێغەمبەری خـودا لـە دڵـی منداڵەکـەم بچێنم؟

خۆش ویستنی پێغەمبەر دروودی خوای گەورەی لەسەر بێت، یەکێکە لە بنچینەکانی ئەم پەیامە پیرۆزەیەو یەکێکە لە بنەماکانی ئیمان، ئیمانی کەسێکمان بێ خۆشەویستی ئەو تەواو نیەو کەم و کورتی تێدایە، چونکە ئەو نێردراوو پەیامبەرو هەڵبژێردراوی خودایە، بۆیە لەسەرباوان پێویستە بە منداڵەکانیانی بناسێنن و خۆشەویستی ئەوی لە دڵدا بەچەسپێنن، ئەویش لە رێی:

### یەکەم: پێگەو مەکانەتی پێغەمبەر لە شەرعدا

سەرەتا پێویستە پێگەو مەکانەتی پێغەمبەر بزانرێت لەشەرعدا بۆ ئەوەی بە ئاسانی مەبەستەکە بگەیەنرێت، بۆ نموونە لە فەرموودەیەکدا: (عن أنس عن النبيﷺ قال ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان: أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يقذف في النار). بخاري

یغەمبەر درودی خوای لێبێت فەرموویەتی: سێ شت هەن لای هەرکەسێك هەبن ئەوا چێژو لەزەتی ئیمانی دەبێت، ئەوانیش: خوای گەورەو پێغەمبەری خودای لەلا خۆشەویسترین بن زیاتر لە هەموو شتێ، هەرکەسێکیش خۆش ویست لەبەر خودا بێت، وە پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە سەر بێ باوەڕی وەك چۆن پێی ناخۆشە بخرێتە ناو ئاگرەوە.

هەروەها أنس بن مالكٍ رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحبَّ إليه من ولده ووالده والناس أجمعين)).

واتە: هیچ کەسێ ئیمانی نیە هەتا منی لە منداڵەکەیو باوکیو هەموو خەڵکی زیاتر خۆش بوێت.

یان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ال عمران

واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە

فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە).

زۆر ئایەتو فەرموودەی تر هەن لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستی خوداو پێغەمبەر لەپێشەنگی هەموو خۆشەویستەکانی تردا بن، گرنگ ئەوەیە کە بزانرێت خۆش ویستنی سەروەرمان خۆی لە خۆیدا سوودو قازانجی بۆ خۆمانەو ئەوان هیچ پێویستیان بە خۆشەویستی ئێمە نیە، ئەوە ئێمەین پێویستمان پێیەتی.

کاتێك منداڵەکەت بۆی ڕوون بوەوە خۆشەویستی خودای گەورە پەیوەستە بە شوێن کەوتنی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێتو خۆشویستنی ئەو کات پێگەو مەکانەتی گەورەیان بۆ دەردەکەوێت.

## دووەم. چۆن پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت بە منداڵ بناسێنین؟

١. باسکردنی کەسایەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت بەو جۆرەی لە قورئان و سونەتدا ئاماژەی پێ کراوە، بۆ نموونە: مژدەدەر ، ئاگادار کەرەوە ، خاوەنی جوانترین ڕەوشت ، بەبەزەیی ، ڕووخۆش ..... هتد

٢. لەوانەیە منداڵەکەت بپرسێت بۆچی دەبێت پێغەمبەرم خۆش بوێت، حیکمەت چییە لە خۆشەویستیمان بۆ ئەو؟بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستە دڵنیایان بکەینەوە و تێیان بگەیەنین کە هەموو کەسێکی ژیرو هۆشیار باوەڕدار پێویستە سەرەوەری خۆشبوێت، لەبەرئەوەی مرۆڤایەتی بەهۆی ئەوەوە ڕێنموویی خوای گەورەی پێ گەیشت و بەرەو دادپەروەری و ڕاستی و نوری ئیمان گەیشتن.

٣. پێیان بوترێت پێغەمبەرمان ئەو زاتەیە کە لە ڕۆژی دواییدا تاکە کەس و پەیامبەرە کە فریامان دەکەوێت و

شەفاعەتمان بۆ دەكات لەلای خوای گەورەو ڕزگارمان دەكات لە نارەحەتیو سەختی ڕۆژی دوایی.

٤. باس لەوە بكرێت هەموو پێغەمبەران لەلایەن خوای گەورەوە پاڕانەوەی تایبەتیان هەبووە كە هەر لە دونیادا خوای گەورە وەلامی داونەتەوە، بەلام تەنها پێغەمبەری خودا ئەو دوعایەی هەلگرتووە بۆ ڕۆژی دوایی كە بۆ ئومەتەكەی هەلگرتووە، ئایا شایانی ئەوە نیە كە خۆشمان بوێت؟!

٥. مژدەدان بە هاتنی لەلایەن هەموو پێغەمبەرانی پێشووەوە سەلامی خوایان لێبێت كە ئەو كۆتا پەیامبەری خودایە، وە ڕێزو خۆشەویستییان بۆیو پێشوازی تایبەتیان لێكردووە لە شەوی ئیسراو میعراجدا.

## سێیەم: چەسپاندنی خۆشەویستی پێغەمبەر لە دڵی منداڵەکانماندا.

١. باسکردنی موعجیزەکانی بۆ منداڵەکەت، پێویستە ڕەچاوی تەمەنی منداڵەکە بکرێت.

٢. باسکردنی ڕەوشت و یارمەتیدانی بۆ هەژاران و ستەم لێکراوان و پشتیوانی کردنیان.

٣. زۆر گرنگی داوە بە هەتیوان و وەسیەتی کردووە بە باش مامەڵە کردن لەگەڵیان.

٤. یاری و پێشبڕکێی لەگەڵ منداڵان کردووەو ڕێزی لێ گرتوون، هەرگیز لێیان توڕە نەبووە.

٥. باس لە چیرۆکانە بکە کە پێغەمبەر لەگەڵ منداڵان بووەو یارمەتی داون و ئەگەر غەمبار بووبن دڵ نەوایی کرددون، بۆ نمونە ئەنەسی کوڕی مالك برایەکی بچوکی دەبێت ناوی عومەیرە، عومەیر چۆلەکەیەکی بچووکی دەبێت ناوی (نوغەیر)ە، نەخۆش کەوتووەو زۆر دڵ گرانە پێی، کاتێك پێغەمبەر دەزانێت دەچێتە لای و هەواڵی

چۆلەکەکەی عومەیر دەپرسێت و دەفەرموێت عومەیر نوغەیر چییەتی؟ ئەویش دەڵێت نەخۆشە، کاتێک دەبیستێتەوە کە چۆلەکەکە مردووە بەتایبەتی سەردانی عومەیر دەکات و دڵ نەوایی دەکات و یاری لەگەڵ دەکات، یان بەبەزەیی بوە تەنانەت لەگەڵ ئاژەڵانیشدا.

٦. پێویستە باوان بەکردار خۆشەویستی خۆیان بسەلمێنن بۆ نەوەکانیان، ئەویش بە پابەند بوون بە سوونەتە پیرۆزەکانی، چونکە یەکێك لە رێگە کاریگەرەکانی پەروەردە ئەوەیە باوان خۆیان کردار بەو وتانە بکەن کە دەیانڵێن، چونکە منداڵ هێندەی بەکرداری دەوربەری کاریگەر دەبێت هێندە بە وتەو ئامۆژگارییەکانیان کاریگەر نین.

٧. ئاشناکردنی منداڵ بە ژیاننامەی پیرۆزیان و وەلام دانەوەی ئەو پرسیارانەی لە مێشکی منداڵدا دروست دەبن دەرباری پێغەمبەری مەزن درودی خوای لێ بێت.

٨. یارمەتیدانی منداڵ بە لەبەرکردنی فەرمووده کورتەکان و هاوکات بە کردار کردنیان، بۆ نموونە،

فەرمودەیەك كە باسی ڕاستگۆیی یان ئەمانەت پارێزی و هاوكاری كردنی كەسانی تر ئەمەش بەكردار لەبەردەم منداڵدا بكرێت بۆ ئەوەی چاو لە گەورەكانی بكات و تێ بگەیەنرێ كە ئەم كارانە خوداو پێغەمبەرەكەی دڵخۆش دەكات و ئەویش لەبەرامبەردا پاداشتمان دەداتەوە.

٩. كاتێ منداڵەكەت بینی كارێكی باش و دروستی كرد ئەوا پاداشتی بكەو یان ئەو سەرپشكی بكە لە هەڵبژاردنی ئەو خواردنەی ئارەزووی دەكات یان شوێنێك كە پێی خۆشە، ئەم پاداشت كردنە هانی منداڵ دەدات زیاتر هەڵسێ بە كاری باش، بەڵام وای لێ نەكرێت بۆ هەركارێك چاوەڕێی پاداشت بكات، بەڵكو تێگەیەنرێت پاداشتی ئەو لەلایەن خوای گەورەوەیە.

هەموو ئەمانە وا دەكەن هەست و سۆزی منداڵ بۆ ئەم پەیامبەرە دڵسۆزە بجوڵێت و خۆشی بوێت، كاتێكیش كەسێكی خۆشویست ئەوا هەوڵ دەدات هەموو فەرمانەكانی جێ بەجێ بكات.

## ئەو هەڵانەی کە پێویستە دایكو باوك لێی دوور بکەونەوە

هەندێ کردار هەیە لە لایەن دایكو باوکەوە وا لە منداڵ دەکەن کە دوور بکەوێتەوە لە خوداو پێغەمبەرو پەیامی پیرۆزی ئیسلام، ئەوانیش:

١. زۆرکردن لە منداڵو سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان بۆ ئەوەی منداڵ فەرمانەکانیان جێ بەجێ بکات، بۆ نموونە بە زۆر نوێژ پێ کردن یان ڕۆژوو گرتن، یان هەڕەشە کردنو ترساندنی بەوەی ئەگەر بە گوێم نەکەی یان نوێژو ڕۆژوو ...... هتد، نەکەن خوای گەورە کوێرتان دەکات یان دەتانخاتە ئاگرەوە، ئەمە وا لە منداڵ دەکات خوداو پێغەمبەر بە کەسێکی تووڕەو خراپ وێنا بکات، بۆیە دوور دەکەونەوە لەهەر شتێك پەیوەندی بە دینەوە هەبێت.

٢. منداڵ بردنە ئەو خوێندنگا ناحکومیانەی کە وانەکانی ئاینی مەسیحیو جولەکە وەك بابەتی سەرەکی یان ئامانجدار لە بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی، ئەمەش کار بە بیروباوەڕی منداڵ دەکات.

٣. گوێنەدان و نەناسینی هاوڕێی منداڵەکەیان و خێزانی هاوڕێکانیان، کە ئەمە زۆر کێشەیە، پێویستە هەڵبژاردنی هاوڕێی باش لە خێزانە باش و باوەڕدارەکانەوە بگرنە ئەستۆی خۆیان، چونکە منداڵ زۆر کاریگەر دەبێت بە ڕەوشتی هاوڕێکەی.

٤. جێ بەجێ کردنی هەر ڕەوشت و ئاکارێك کە خوای گەورە پێی ناخۆشە، چونکە منداڵەکانیش چاو لە ئێوە دەکەن و ئێوەش بە پرسیارن لەهەر کارێکی هەڵە کە لێتانی وەردەگرێت.



## منداڵ فێری چی بکرێت؟

پێویسته منداڵ فێری چەند ئاکارێکی جوانی ئیسلام کە ڕۆژانە دێنە ڕێی بکرێت، کە سوودی بۆ لایەنی ئیمانیو کۆمەڵایەتیو تەندرووستیشی هەیە ئەوانیش:

**یەکەم:** ئادابەکانی خواردنو خواردنەوە.

پێویسته منداڵ ڕابهێنرێت لەسەر چەند کارێك کە پەیوەندی بە خواردنو خواردنەوەوە هەیە ئەوانیش:

* پێش دەست کردن بە خواردن دەستەکانی بشوات.

* دوای ئەوەی خواردن ئامادە کرا و هەموو پێکەوە دانیشتن، نزای نان خواردن بکاتو بڵێت: (اللهم بارك لنا فيما رزقتنا وقنا عذاب النار). واتە: خودایە بەرەکەت بخەیتە ئەوەی پێت بەخشیوینو لە ئاگری دۆزەخ بمان پارێزی.

* بەکارهێنانی دەستی ڕاست لە کاتی نان خواردن و فوو نەکردنە خواردن.

★ ئەوەندە بکرێتە قاپەکەیەوە کە توانای خواردنی هەیە، بۆ ئەوەی دوایی نەڕژرێت، چونکە ئەوە زیادەڕەوییەو خوای گەورە پێی ناخۆشە.

★نەخواردنی هیچ شتێك بە پێوە، یان ڕاکشانەوە.

★. نەخواردنەوەی ئاو یا شلەمەنییەکان بە پێوەو خواردنەوەیشی بەسەریەکەوە نەبێت، بەڵکو بە سێ قوم.

★ قسەنەکردن کاتێك پاروو لە دەمماندایە.

★ کاتێك لە دەرەوە بوون نابێ خواردن بە دەستیانەوە بێت، نەوەك منداڵی تر ئارەزووی بکات و تواناشی نەبێت بیکرێت.

★ دوور کەوتنەوە لە خواردنەوە گازیەکان و هەموو جۆرەکانی جیپس.

★ وتنی نزای دوای نان خواردن : ( الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا وجعلنا مسلمين )، پاشان دەست خۆشی کردن لە دایکی بۆ ئامادەکردنی ئەو خواردنە.

**دووەم: چونە دەرەوەو گەرانەوە.**

باش وایە کاتێک پێکەوە دەچنە دەرەوە نزای چوونە دەرەوە بخوێنن بۆ ئەوەی منداڵەکانیش فێر ببن‌و بیڵێنەوە، نزای چوونە دەرەوە ( بسم الله توكلت على الله ولا حول ولا قوة الا بالله)، کاتێکیش گەڕانەوە بڵێن: ( بسم الله خرجنا وبسم الله ولجنا وعلى الله ربنا و توكلنا).

**سێیەم:** لەبەرکردنی سورەتە کورتەکان‌و تەفسیرەکانیان‌و تێ گەیاندنی منداڵ کە بۆچی پێویست بە خوێندنیان دەکرێت، بۆ نموونە سورەتی (الإخلاص و قل أعوذ برب الناس و قل أعوذ برب الفلق)، خوێندنی ئەم سوورەتانەو لەبەرکردنیان‌و وتنەوەیان بەیانی و ئێوارەو شەوان کاتی خەو هەر یەکێکیان سێ جار. ئەگەر ئەمانە بخوێنێت خودای گەورە دەیانپارێزێ، یان خوێندنی سوورەتی فاتحە کە بۆ شیفا بەسوودە بیزانن، سورەتەکانی تریش بەو جۆرە.

چوارەم: ئادابی چوونە سەر ئاو.

★ منداڵ فێر بکرێت پێش چوونە سەر ئاو بڵێت: (اللهم إني أعوذ بك من الخبث و الخبائث)، پاشان قاچی چەپ پێش بخات بۆ چوونە ژوورەوە.

★ لەکاتی هاتنە دەرەوە سەرەتا قاچی ڕاست بەکار بهێنێتو پاشان بڵێت : (غفرانك).

★ ڕاهێنانی لەسەر دەست شوشتن دوای سەرئاو کردن.

پێنجەم: فێرکردنی چەند ئاکارێکی جوانی تر

یەکەم. خاوێن ڕاگرتنی ژینگەو هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی لەهەر کوێیەك بێت.

دووەم. ڕووخسەت خواستن و لە دەرگا دان کاتێك دەچێتە هەر شوینیك، بە تایبەتی ژووری دایكو باوك.

سێیەم. پاراستنی نهێنی بەگشتیو بە تایبەتی نهێنی خێزانو نەدرکاندنی.

چوارەم. دەستکاری نەکردنی شتومەکی هیچ کەسێك بە بێ پرس.

پێنجەم. گاڵتە نەکردن بە جل‌و بەرگ‌و کەم‌و کورتی کەسانی تر.

شەشەم. گوێ هەڵنەخستن بۆ قسەو دەنگ‌و باسی کەسانی تر.

حەوتەم. هەستان لەبەر کەسانی گەورەو ڕێزگرتنیان بەجوانترین شێوە.

هەشتەم. درۆ نەکردن، چونکە پیشەیەکی زۆر ناشرینە.

نۆیەم. پێویستە لە کاتی باوێشك داندا دەست بە دەممانەوە بگرین.

دەیەم. خۆ کێشانەوەو قرقێنە لێدان‌و خۆ خوراندن لە شوێنی گشتی‌و لەناو خەڵکیدا کارێکی نەگونجاوە.

یانزەیەم. پێویستە هەفتەی جارێك نینۆکەکانی دەستمان (ڕۆژی هەینی بکرێت)، وە ١٥ ڕۆژ جارێك نینۆکی قاچمان بکەین.

دوانزەیەم. تف نەکردنە سەر زەوی، دەست نەکردن بە لوتدا.

سیانزدەیەم. نابێت لە ماڵو قوتابخانەو شەقامەکاندا خۆڵو خاشاك فڕێ بدرێتە سەر زەوی.

چواردەیەم. داوای لێ بوردن کردن هەرکاتێك هەڵەیەك ئەنجام درا.

ئەمانەو چەندین ئادابی تر کە باوان بە پێی ئاستی تەمەنی منداڵەکە دەتوانێت منداڵەکەی فێر بکات.

لەکۆتایدا/ لەخوای گەورە داواکارم سەرکەوتوومان بکات لە پێگەیاندنی نەوەیەکی تەندروستو بەڕەوشتو ئیمان کە لە دونیادا ببنە خزمەتکاری پەیامە پیرۆزەکەی ئیسلامو لە رۆژی دواییشدا ببنە هۆکارێك بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەو باڵادەست.... ئامین

# سەرچاوەکان

لەم سەرچاوانەوە سوود لەم بابەتانە وەرگیراوە


١. https://saaid.net/tarbiah/82.htm

٢. https://saaid.net/tarbiah/165.htm

٣. https://www.al-forqan.net/articles/5142.html

٤. موقع المسلم

٥. بنەماكانى ڕێزو ڕەوشت ..... ئەیوب ئۆزدەمیر




## بەرهەمە چاپكراوەكانی گروپی نما ...

كە تەنها بەبەخشینی (٢٥) هەزاردینار هەر چوار مانگ جاریـــك بەرهـــەمیكمان چـــاپكردوە كـــۆیی بەرهەمـــە چـــاپكراوەكانمان نزیكـــەی ٢٥هـــەزار بەرهەمـــە.خۆت لـــەم پاداشتە نـەبراوە بی بـەش مەكـە و تـۆ ش دەتـوانی بەشدار بیت لەگەڵمان.

١- چۆن نوێژ لای جگەر گۆشەكەت خۆشەویست دەكەیت.

تیراژ (٩٠٠٠) هەزار دانە.

٢- چۆن بالاّ پۆشی لای كچەكەت خۆشەویست دەكەیت .

تیراژ (٤٠٠٠) هەزار دانە.

٣- بۆئەوەی بەختەوەر بیت. تیراژ (٣٠٠٠)هەزاردانە

٤- ئازاری موسلمانان لە جیهاندا. تیراژ (٢٠٠٠) هەزاردانە

٥- پیلانـەكان دژ بـە ئافرەتـانی موسـڵمان. تـیراژ (٣٠٠٠) هەزار دانە.

٦- پەروەردەی ئیمانی منداڵ. تیراژ (٣٠٠٠) دانە.

